

# "تێکەڵاویی زمانی شیعری نالی لە گەڵ زمانی شاعیرانی فارسدا"

**نووسینی :دوکتۆر ئەیوب نەقشبەندی،مامۆستای زانکۆ**

**وەرگێڕان لە فارسییەوە: فەردین مەزهەرپوور**

**پێداچوونەوە:لەتیف سوڵتانی**

**بە درێژایی مێژوو، وێژە و ئەدەبییات هۆکاری دەربڕینی جوانترین و بە سۆزترین هەستەکانی بەشەر بووە . فڕینی خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆ ، وەک تابلۆیکی هەمەڕەنگە ، کە لە ڕەوتی مێژووی هەزاران ساڵەی ژیانی بەشەر وەک پێگەیەک بووە بۆ دەربڕینی ئەو سۆزومەراقەی وا لە دڵی مرۆڤەکاندا بووە .**

**بە درێژایی مێژوو ، شێعر سەمەر و میوەی ئەندێشەی بەشەر بووە . شاعیر وەک باخەوانێک ئەم میوە ئاودار و ترش و شیرینەی ، بەو پەڕی لە خۆ بوردوویی پێشکەشی کۆمەڵگای بەشەری کردووە . شاعیران بە سیحری کەلامی خۆیان لە یەک کاتدا دەروونی خۆیان و ناخی کۆمەڵگایان، وەک ئاوێنەیێک لە ڕاستییەکان نیشانی ئەو کەسانە دەدەن کە لە هەست و ئەندێشەی ناسک بێ‌وەرین !**

**لەو ڕۆژەوە کە مرۆ وەک بوونەوەرێک هاتۆتە سەر زەوی ، شێعر ئامرازێ بووە بۆ دەربڕینی خۆزگە و ئاوات و ناکامی و شادی و بیرەوەرییەکانی . ئەگەر وشە و کەلام و شێعر لە مرۆڤایەتی جیا بکەینەوە ، جیهان وەک زیندانێکی گەورەی لێ دێ . ئەگەر شاعیران غەم ، خۆشی ، ئارەزووەکان ، تاڵی و سوێرییەکانی ژیانی بەشەریان بە شێعری خۆیان دەر نەخستبایێت ، ڕوون و ئاشکرایە مرۆڤایەتی بە خۆی و ناخییەوە ، ئەو هەموو ئاوات و ئارەزوو و قسانەی ، لە ژێر ڕکێفی بێ ڕەحمانەی تێپەڕبوونی زەماندا بۆ هەتاهەتایە جێ دەهێشت و لە یاد دەچوون .**

**لە هەموو کۆمەڵگایێک شێعر وەک هونەرێک ڕێزی لێ گیراوەو شاعیریش وەک پێغەمبەرێک بە سۆزی کەلامی خۆی کاری کردۆتە سەر هەستی گەلەکەی . هیچ نەتەوەیێک نییە لە جیهاندا کە بە شاعیر و نووسەرانییەوە شانازی نەکات و شێعری هەر گەلێک وەک شوناسێکی تایبەتیی ئەو نەتەوەیەی لێ هاتووە .**

**ئەدەبیات خاوەن دوو بەشی سەرەکییە و ئەم دوو بەشە بریتین لە :**

**یەکەم: ئەدەبی چێژ ( التذاذی ) : لە ناوەڕۆکی وشەی ( التذاذ ) بۆمان دەردەکەوێ ئەو جۆرە دەق و نووسینانە لە خۆ دەگرێ ، کە چێژێکی تایبەت بە ناخ و بیر و ئەندێشە دەبەخشن . وەک ( غزل ) و ( قصیدە ) و ( رباعی ) ، ... یا هەر بڕگەیێکی ئەدەبی بێت کە پەند و ئامۆژگاری لە خۆ بگرێ .**

**دووەم: ئەدەبی ( التزامی ) : زۆرتر ئەو دەقانە لە خۆ ئەگرێ کە شاعیر یان نووسەر بە هەر هۆییێکی تاکەکەسی یان جەبری کۆمەڵگاوە بێت ، شێعر و بابەتگەلێک لە پێناو وەدەست هێنانی پلە و پایە و پارە ، یان لە ڕووی ترس و زۆرەوە بنووسێ و نووسینەکانی بڵاو کاتەوە ، یان پێشکەشی حاکمان و دەستەڵاتدارانی سەردەمی خۆی بکات ، وەکوو پەسن ( مدح ) .**

**شێعری مۆسیقایی ( غنایی ) خاوەن پانتاییێکی زۆرە لە شێعری ( التذاذی ) دا و ئەم جۆرە شێعرانە هۆکاری دەربڕینی هەست و مەراقی دەروونی ئینسانەکانە . لە لاییێکیترەوە دەتوانین بێژین کە ئەدەبی ( حماسی ) ئەدەبییاتێکە لە دەرەوەی ناخی مرۆڤدا و ئەدەبی ( غنایی ) ، ئەدەبیاتی ناخ و دەروونی ئینسانە . یا لە ڕوانینێکیترەوە ( حماسە ) گێڕانەوەی قارەمانەتی و بەرخۆدانی هەرگەلێکە و ئەدەبیاتی ( غنایی ) گێڕانەوەی ئەندێشەی دەروونیی و تەنیاییەکانی تاکی هەر کۆمەڵگایێکە .**

**ئاشکرایە ئەو گەلانەی وا خاوەن مێژوویێکی دوور و درێژن لە فەرهەنگ و ئەدەبدا ، ناوەڕۆک و ڕۆحی هونەرەکانیان ، بە تایبەت لە شێعردا لێک دەچن و لە یەک نزیکن . گۆڕینەوەی ئەندێشە و هێما و ئارەزووەکان و خەونەکانیان بە درێژایی مێژوو لە گەڵ یەکتردا زەق و بەرچاو و ڕوونە.**

**ناسینی تێکەڵاویی زمانی شاعیرانی جیهان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پەیوەندییە فەرهەنگییەکان وەک گرێ کوێرەیێکە کە زۆربەی گەلانی جیهانی بە یەکەوە بەستۆتەوە .**

**لێرە لەم وتارەدا ، تێکەڵاویی زمانی شێعری ، شاعیری پایەبەرز و ناسراوی گەلی کورد ، حەزرەتی " نالی " لە گەڵ زمانی شاعیرانی شێواز و سەبکی ( عراقی ) ، وەک " حافظ " و " سعدی " و " خاقانی " ، لە مەڕ نزیکایەتی ناوەڕۆک و بابەت و دەربڕینی هەست و ئیحساسدا دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە**

.جێی  خۆیە بوترێ ئەو پەیوەندییەی وا لە قەرزدان و قەرزگرتنی جوانیی و بابەت و ئەندێشە دا بەدی دەکرێ ، نیشانەی چاولێکردنی کوێرانە نییە، بەڵکو نیشانەی بیرێکی قووڵی ئینسانییە.

لەم وتارەدا هەوڵ دراوە خاڵە بە هێزەکانی شێعری حەزرەتی " نالی " لە گەڵ ئەو تێکەڵاوییەی وا لە گەڵ خاڵە بەر چاوەکانی زمانی شێعری " غنایی " فارسیدا هەیەتی باس و تۆژینەوەی لە سەر بکرێت .

زمانی پەسن ( مدح ) لە شێعردا ، لە دوای هاتنی ئیسلامەوە ، بە تایبەت لە شێواز و سەبکی " خراسانی " دا ، زمانێکی توانایە و " قصیدە " گەلێکی زۆر لە سایەی ئەم شێوازەوە لە دایک بووە . لە شێواز و سەبکی " عراقی " دا شاعیر بێپەردەتر باسی گەورەیی و شکۆمەندی ئەو کەسە ( ممدوح ) دەکات کە ستایشی کردووە . کەمتر درێژە دەدات بە کەلام ، بە تایبەت لە " غزل " دا ستایش زۆرتر خۆی لە یەک یان دوو بەیتدا ئەبینێتەوە.لە شێعری " نالی " دا ستایش کردن کوڵ و کورت و بێ زێدەڕۆییە. زمانی ستایشی شێعری " نالی " زۆرتر لە زمانی " حافظ " نزیکە . ( وەرگێڕ : پێویستە ئەوەمان لە یاد بێت کە ستایش کردن لە شێعری کوردیدا کەمە و تا ڕادەیەک عەیب بووە ! ئەو شاعیرانەش وا ستایشیان کردووە زۆرتر ستایشی پێغەمبەر و ئەسحاب و گەورە پیاوانی دینییان کردووە و ئەگەریش ستایشی حاکم و دەستەڵاتیان کردبێت لە ڕووی هەستی نەتەوایەتییەوە بووە ! )

" نالی " لە ستایشی " سلێمان پاشای بابان " دا فەرموویەتی :

شاهی جم  جا نالیا ( تاریخ جم ) تەئریخییە

تا نەڵێن لەم عەسرەدا ئەسکەندەری جەم نەبوو

لە تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا

سەدای مۆزیقە و نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو        ص٣٩

" نالی " زۆربە شان و شکۆی حاکمانی کوردستاندا ، بە تایبەت حاکمانی باباندا هەڵیداوە و ستایشیانی کردووە . سەرباری ئەوەی کە " نالی " لە گەڵ حاکمانی باباندا دۆستایەتی نزیکی هەبووە ، بەڵام قەد بۆ پلە و پایە هەوڵی نەداوە و هیچ کاتێکیش چاوەڕوانی دیاریی نەبووە !

" نالی " لە ڕۆژانی فەقێیەتی ، بە شوێن عیلم و زانیندا بە شار و لادێیەکانی کوردستاندا گەڕاوە. کاتێکیش  کە لەو پەڕی کەم دەرامەتی و فەقیریدا بووە ، قەد دەستی نیازی لە کەسێک و لە حاکمێک

**درێژ نەکردۆتەوە . لەم چەند بەیتەدا باسی ئەو ڕۆژە ڕەش و تاریکانەی نەداریی و هەژاریی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێ :**

**دوودی سەر میچی گوڵەنگی لەت لەتی دەسرازە کۆن**

**بان و دیواری بە میسلی لانکەی ئەجزا شکاو ص ٣٥٦ بیت ٢**

**ئاسمان هەورین دەبێ ، ئێمەش بە غەمگینی دەڵێین :**

**ئەی خودا چبکەین لە ژێر ئەم کاولەی کەس تیا نەماو !؟ ص ٣٥٨ بیت ٦**

**" نالی " لە ستایشەکانیدا زۆرتر باسی دۆستایەتی و نزیکی خۆی لە گەڵ ئەوانە دەکات کە ستایشییانی کردووە . بە ڕاستی شاعیری دەربار نییە و لە هیچ کاتێکدا کەلام و شێعری خۆی لە پێناوی دیاریی و پلە و پایەدا هەرزان فرۆش نەکردووە و ڕۆحی دەماخ بەرزی بە شێعرەکانییەوە دیارە. ستایشە ئاشقانەکانی " نالی " وا لە ترۆپکی جوانیی و بە هێزیدایە . یار و دڵدار لە شێعرەکانی " نالی " دا زۆرتر دڵدارێکی مەجازی‌یە و هەر هەموو دڵدارەکانی لە جنسی مێیینەن !. ( وەرگێڕ : بە پێچەوانەی شاعیرانی فارس کە ستایشی معشوقی هاوجنسی خۆیانیان کردووە ! )**

**" نالی " فەرموویە :**

**لالەن بە بەدەن ، ئەتڵەسی ئەخضەر کە لە بەر کەن**

**نەوڕەستە گوڵن ، بەستە لە گەڵ دەستە گیاهن ص٣٤٣ بیت ٧**

**بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەو سەرو قەدانە ،**

**صۆفی لە طەڵەبدان و ، هەموو سالیکی ڕاهن ص ٣٤٤ بیت ٩**

**بە چاو خشاندنێکی ورد بە ژیان و دیوان و شێعرەکانی نالیدا بۆمان دەر دەکەوێ کە نالی کەسێکی سۆفی و عارف نەبووە . بەڵام تا ڕادەیەک ئیرادەتی بە تەریقەتی نەقشبەندییەوە بووە . لە لایێکی ترەوە " حافظ " یش وەک شاعیرێک ئەهلی سەیر و سلووکی عارفانە نەبووە و موریدی هیچ پیرێکی تەریقەت نەبووە . بەڵام لە برێ لە غەزەڵەکانی‌دا جوانترین تابلۆکانی عیرفان و تەسەوفی خولقاندووە .**
**خوێندنەوەی نالی لە ئایین ، خوێندنەوەییێکی شەریعەتانەیە ، نەوەک عارفانە ! ئەوەی ئاشکرایە " نالی " زۆرتر ستایشی مەعشووقی مەجازی کردووە !**

**پێم دەڵێن : مەحبووبە خێڵ و قیچە ، مەیلی شەڕ دەکا**

**خێڵ و قیچە ، یا تەرازووی نازی، نەختێ سەر دەکا !؟ ص ۱۰۸ بیت ۱**

**نالی کەمتر لە بێ وەفایی و جەفای یار گلەیی دەکات . زۆرتر ناز و لەنجە و لاری یارەکەی وەسف دەکات . بە دڵنیاییەوە نالی شاعیرێکی ناکام نەبووە و هاوسەری ژیانی ، هەر هەمان مەعشووق و دڵداری بووە . شێعری " نالی " وەک شێعری " حافظ " بۆن و بەرامەی خۆشی و شادی لێوە دێ و کەمتر باسی فەراق و دووری یاری دەکات و ئومێد بە وەسڵ لە شێعرەکانیدا شەپۆل دەدات . " نالی " بۆ دەرخستنی جوانیی شێعرەکانی ڕێبازی عیلمی ( بدیع )ی بە باشی زانیوە و ناسیوە . زۆر جار لە (جناس ) کەڵکی وەرگرتووە و لەم بوارەدا زمانی شێعری " نالی " زۆر لە زمانی شێعری " خاقانی " دەچێ .**

**برۆت هەر چین و پەرچەم چین لە سەر چین**

**ئەمەندە چینە ، قوربان ، پێم بڵێ چین !؟ ص ۳۴۶ بیت ۲**

**" نالی " زۆر جار بە وشەئارایی( واج آرایی ) لە شێعرەکانیدا ، تابلۆگەلێکی جوان دەنەخشێنێ . وەک ئەم غەزەلە کە ڕەدیفەکەی بە زمانی فارسییە :**

**ڕوخم ڕەنگینی ڕەنگی ڕوومەتی ڕەنگینتە ، بازا !**

**قەدی سەروم کەمانینی قەدی شیرینتە ، بازا ! ص ۹۵ بیت ۱**

**" نالی " پیاوی دینە ، بەڵام لە دیندا توندڕەو نییە و هەست کردن بە ئەڤین و خۆشەویستیی وەک خۆراکێک بۆ ڕۆحی ئینسان دەزانێ . لەم بەیتەدا لە نێوان ئاشق و عاقڵدا هەڵسەنگاندنێک دەکا و "عشق و عاشق" بە براوە دەزانێ !**

**ئاشق هەوەسی مەیکەدە و عیلمی بەسیتە**

**ئاقڵ تەڵەبی مەدرەسە و جەهلی مورەککەب ص ۱۳۵ بیت ۶**

**لە شێعری فارسیشدا ، شاعیرانێک هەن کە ئەشق بە براوە دەزانن ، ئەقڵیش بە کۆت و بەندێک بۆ ئیحساس و عاتیفە هەژمار دەکەن .**

**" نالی " شێعر و پلەی کەلام ، وەک زۆربەی لە شاعیران بە بەها و نایاب دەزانێ و شێعر بە حیکمەت ناو دەبات و دەفەرمێ :**

**" نالی " نیيەتی سیحری بەیان ، حیکمەتی شیعره**

**ئەمما نیيەتی قووەتی دڵ ، قودرەتی ئینشا ص ٧٨ بیت ٧**

**شێعری " نالی " خاوەن سێحرێکی ئەفسوونگەره و لە هەمان کاتیشدا خاوەن حیکمەتێکی گەورەیە. شاعیر خۆی بە بەر پرسیار دەزانێ بەرانبەر بە شاعیر بوونی ، نە کەلام فیدای مانا دەکات ، نە مانا بە قوربانی کەلام !**

**شاعیرێک بە هێزە کە بتوانێ لە شێعرەکانیدا تابلۆگەلێکی ڕەنگین خەلق بکات . " نالی " بەو پەڕی تواناییيەوە ئەم تابلۆگەلە لە شێعرەکانیدا دەخولقێنێت .**

**ئەو ڕیتم و کێشا( وزن )نە وا " نالی " لە چوار چێوەی ئەواندا شێعری هۆنیوەتەوە ، زۆربەیان شادن. ئەو کێشانە کە " نالی " کەڵکی لێ وەرگرتوون ، لەو وەزنانە دەچێ کە شاعیرانی شێواز و سەبکی ( عراقی ) ، بە تایبەت " حافظ " و " سعدی " شێعریان پێ هۆنیوەتەوە . " نالی " زۆرتر لە بەحری ( هزج ) دا شێعری وتووە و پێ دەچێ کەسێک بووبێت کە ژیانی دوور لە تاڵی و سوێری بە سەر بردبێت و کەمتر فیراق و دووری یاری کێشا بێ ! ( وەرگێڕ : بەحری هزج ، بەحرێکی شادە ) .**

**ڕەقیب و موددەعی فیتنە و عیلاقەی چاوی جادووتن**

**لە گۆشەی گۆشەوارەت نائیبی هارووت و مارووتن ص ٣٢٦ بیت ١**

**زولفانی سیيەه مەستی وەکوو چاوی ( حەبیبە )**

**غارەت کە بکەن ، دێن و دەچن ، ڕۆح برفێنن ص ٣٣٩ بیت ۶**

**زولفت کە لە سەر ڕوو بە خەم و تابشە ئەمڕۆ ،**

**دوودی سیەهی عوودە لە سەر عاریزی پشکۆ ص ٣٨۴ بیت ١**

**سەبارەت بەو پێشەکییەی وا خوالێخۆشبوو مەلا عەبدولکەریمی "مدرس " و مامۆستا " فاتح عەبدولکەریم " ، لە بەرایی دیوانەکەی " نالی " دا نووسیویانە ، خستنە ڕووی ئەم خاڵە بە گرنگ دەزانم :**

**لە پێشەکی دیوانی " نالی " دا بە جۆرێک کاریگەریی ئەدەبیاتی پارسی لە سەر " نالی " و شێعری ئەو خراوەتە پشت گوێ و باسی لێ نەکراوە ! هەوڵ دراوە ئەوە بسەپێندرێ کە ئەدەبی عەرەب کاریگەرتر بووە لە سەر " نالی " ! . ( وەرگێڕ : پێ دەچێ ئەم خاڵە بۆ هەل و مەرجی ئەوسای باشووری کوردستانی ئێراق و ئێراق بگەڕێتەوە کە لە کتێب و چاپەمەنییەکاندا هێنانی ناوی " فارس " بڤە بووبێت و لە لایێکی ترەوە ئەو عەلاقە و هۆگرییە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی "مدرس " بە عەرب و فەرهەنگی عەرەبەوە بوویەتی کاریگەریی کردۆتە سەر ئەم پێشەکییە )**

**لە شێعرەکانی " نالی " دا وشەگەلێکی فارسی بە دی دەکرێ و ئەگەر وشەی عەرەبییش هاتبێت ، زۆرتر ئەو وشانەن کە عەربیین و لە کوردی و فارسی بە کار هێنانیان زۆرە. ( وەرگێڕ : نەک لە دیوانی " نالی " دا ، بەڵکوو لە دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کورددا وشەگەلێک هەیە کە بە دڵنیاییەوە ناتوانین مۆرکی فارسی بوونیان پێوە بلکێنین ، ئەوەش بۆ هاوڕەچەڵەک بوونی زمانی کوردی و فارسی دەگەڕێتەوە ) .**

**ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا ،**

**یا شەمسی جەمالت شەوی گێڕاوە بە فەردا ؟ ص ٧٩ بیت ١**

**گوڵ هاتە دەرێ ، لافی لە حوسنی بوتی ما دا**

**لەرزی قەدی بەرزی ، لە ڕقا زولفی کە با دا ص ٨٣ بیت ٢**

**وەها مەستی تەماشای چاوتە " نالی " کە نازانێ**

**بە بێداری دەبینێ ، یا لە نەشئەی مەستیی و خەودا ! ص ٨٩ بیت ٧**

**لە دیوانی " نالی " دا چوارینەیێک بە زمانی فارسی هاتووە :**

**سوی مصر است مرا عزم از این لجەی غم**

**تا کە در نیل کشم جامە ز بیداد و ستم**

**می‌رود " نالی " از این جا چو حریص از دنیا**

**با لب خشک و کف خالی و چشم پر غم**

**له لاپەڕە ١٦٨ی دیوانی " نالی " دا ، غەزەلێکی فارسی هاتووە کە لەو پەڕی جوانی و ناسکی دایە . زمانی غەزەل پڕ لە ئەشق و سۆزە ، کە ڕەوانیی و بەهێزی خامەی " نالی " لە هۆنینەوەی شێعری فارسی‌دا دەسەلمێنێ . ئەوەشمان بۆ دەر دەخات کە " نالی " هۆگرێکی شێعر و ئەدبیاتی فارسی بووە . ئەم غەزەلە ناسکەی " نالی " ، جوانیی و تەڕ و پاراویی شێعری " حافظ " و " سعدی " بە بیری خوێنەردا ئەهێنێتەوە و پێوە دیارە. کاتێ دەڵێ :**

**ابروان تو طبیبان دل افگارانند**

**هر دو پیوسته از آن بر سر بیمارانند**

**گنج رخسار تو دیدن نبود زهره مرا**

**که ز زلف تو بر او خفته سیه مارانند**

**ما هزاران ، ز غمت خسته و ناکام ولی**

**کامیاب از گل روی تو خس و خارانند**

**بر سر کوی خود از گریه مکن منع مرا**

**زآنکه گل‌های چمن منتظر بارانند**

**نرگسان تو که خواب همه عالم بردند**

**خفتگانند ، ولی رهزن بیدارانند**

**" نالیا " ار چه سگانش همه شب نالانند**

**که نه آن شیفتگان نیز جگر خوارانند**　　　　**ص ١٦٨**

**هەروەها کە پێشتر باسی لێ کرا ، " نالی " ئەهلی شەریعەتە نەوەک تەریقەت . ئەو لە وشکە سۆفی و ئەو کەسانەی کە ڕیا دەکەن و خۆیان بە پاک دەزانن ،خۆی دوور ڕادەگرێ و زۆر جار لە شێعرەکانیدا بە وشەی " وشکەسۆفی " ناویان دەبات . ڕەندیی و ئازادی بە ڕوخساری شێعرەکانییەوە دیارە . کاتێ دەڵێ :**

**خۆشا ڕەندێ لە دنیا بێ موبالات و موجەڕەد بێ !**

**بە ڕۆژ زیندەی جەماعەت بێ ، بە شەو مات و موجەڕەد بێ !　　ص ٦٣١ بیت ١**

**ئەگەر تەکیە ، ئەگەر شێخە ، هەموو داوی عەلایق بوون**

**بڵا " نالی " بچێ مەستی خەرابات و موجەڕەد بێ !　　ص ٦٣٢ بیت ٥**

**وەکوو سۆفیی سافی مەبە ئالوودە بە دونیا**

**بێهوودە موکەددەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب　　ص ١٣٤ بیت ٤**

**سۆفی‌یی خەڵوەتنشین بۆ نەزەرێکی گوڵی ڕووت**

**ڕەنگە وەک نەرگسی تەڕ چاوی سپی بێت و دەرێ　　ص ٦٥١ بیت ٢**

**لە شێعری فارسیدا ، شاعێرگەلێکی زۆر ( تضمین ) و ( ملمع ) یان بە کار بردووە . بەڵام لە ( مصراع ) ێک یان دێڕێکدا ! لە کاتێکدا " نالی " تێکەڵێکی تایبەت و جوانی داوە بە وشە و دەڵێ :**

**تیر ناز نگهت هر دله نیجه یری وار**

**عاشقک پاینه زولفک گیبی یوزبک سری وار　　ص ٢١٧ بیت ١**

**بزم می در ، ندما جمع ، قدح گرد شده**

**سوفی نک ورد و دعای سحر یله یری وار　　ص ٢١٨ بیت ٣**

**لە دیوانی " نالی " ، لە لاپەڕی ٢١٩ دا ، دوو دێڕ هاتووە و لە شەرحی ئەو دوو بەیتەدا نووسراوە کە ئەم دوو بەیتە " نالی " لە زمانی عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی ! بەڵام ئەم دوو بەیتە هی نالی نیین و هی " معزی " شاعیری دەرباری سەلجوقییەکانە .**

**آن زلف مشکبار بدان روی چون نگار**

**گر کوته است ، کوتهی از وی عجب مدار          ص ۲۱۹ بیت ۱**

**شب در بهار میل کند سوی کوتهی**

**آن زلف چون شب آمد و آن روی چون بهار          ص ۲۱۹ بیت ۲**

**وەسفی " نالی " لە مەعشووق تازە و جوانە . کەمتر شاعێرێک توانیبێتی وەک " نالی " وەسفی جوانیی مەعشووق و دڵبەری بکات**

**دەخیلت بم نەخیلی یا ڕوتابی**

**وەها شیرین و سینە نەرم و دڵڕەق !          ص ۲۵۲ بیت ۲**

**زمانی شێعری " نالی " لە زمانی شێعری شاعیرانێ وەک " خاقانی " و " انوری " و " حافظ " و " سعدی " و " بیدل " و " صائب " ، زۆر نزیکە . ئەگەر بە چاوێکی وردەوە سەیری شێعرکانی " نالی " بکرێت ، تابلۆگەلێکی نەخشین لە شێعری ئەم شاعێرانە لە شێعری " نالی " دا بەدی دەکرێت . ئەمە بەو مانایە نییە کە " نالی " بە خوێندنەوەی شێعری ئەوان بۆتە " نالی " ! بەڵکوو " نالی " لە فەرهەنگ و زمانی خۆیدا هەڵکەوتووە و ئەو زمان و فەرهەنگەیە کە " نالی " کردۆتە " نالی " !**

**بەڵام گۆڕینەوەی ئیحساس و زمانی شیعریی ، لە نێوان شاعیرانێ کە لە یەک هەرێمدا ژیاون ، بە پێی ئاڵ و گۆڕە فەرهەنگییەکان و هاتووچۆی فەرهەنگییەوە شتێک نییە کە کەس بتوانێ ڕەتی بکاتەوە . ( وەرگێڕ : ئەم دێڕانە بە مانای چاولێکردنی " نالی " لە کەسێک یان کەسێک لە " نالی " نییە . بەڵکو تەنیا گۆڕینەوەی ئیحساس و عاتیفە و زمانی شێعرییە ، کە زۆر جار نووسەران و شاعیران خۆیان لەم ئاڵ وگۆڕکردنە نائاگان ! )**

**لە دەرەوەی شێواز و سەبکی ( عراقی ) دا ، زۆرێ لە شاعیرانی ( شبەقارە ) لە غەزەلەکانی فارسی بە گەرمی پێشوازییان کردووە . " حافظ " دەڵێ :**

**طوطیان هند همه شکرشکن شوند**

**زین قند پارسی کە بە بنگالە می‌رود**

**له دەوران و شێواز و سەبکی ( هندی ) برێ لە شاعیرانی ئەسپەهان ڕوویان کردە هێندستان . ئەمە بووە هۆی کاریگەریی شێعری ئەسپەهان بە سەر شێعری ( شبەقارە )ی هیندوستانەوە . لە شێعری شاعیرانی شێواز و سەبکی ( خراسانی ) دا ، بە تایبەت شێعرەکانی " منوچهری " ، کاریگەریی زمان و شێعری عەرەب بە سەریانەوە دیارە . لێرەیە کە ئیتر تێکەڵاویی زمان بە مانای چاو لێکردنی کوێرکوێرانە نییە ، بەڵکوو هاوفکری و هاوبیرییە لە خەملاندنی خەیاڵ و ئیحساس ! غەزەل و قەسیدەی فارسی کاریگەرترە بە سەر " نالی" ییەوە تا شێعری عەرەب . ئەمەش بۆ یەک ڕیشە بوونی زمانی کوردی و فارسی دەگەڕێتەوە .**

**داری سەوڵ (سەرو) لە دێر زەمانەوە وەک درەختێکی پیرۆز ، لە فەرهەنگی ئێرانییەکاندا چاوی لێ کراوە . لە شێواز و سەبکی ( خراسانی ) و ( عراقی ) دا ، شاعیرانێکی زۆر لە شێعرەکانیاندا سەرویان بە کار بردووە . سەرو سەمبۆلی ڕاست قامەتی یار و ئازادەگی بووە . " نالی " لە شێعرەکانیدا سەرو وەک خوازەیێک (استعارە) لە یار بە کار ئەبات . ئەمە لە کاتێکدایە کە لە فەرهەنگی کوردەواری ، بە تایبەت فۆلکلۆری کوردی ، داری چنار وەک ئیستعارە لە قامەتی یار بە کار هاتووە . پێ دەچێ " نالی " لە شێعری خۆیدا سەروی هەر وەک مانای سەرو لە شێعری فارسی دا بە کار بردبێت . ( وەرگێڕ : خستنە ڕووی ئەم خاڵە بە گرنگ دەزانم کە " نالی " زۆربەی ژیانی لە سلێمانی ، ناوەندی حکوومەتی بابان بە سەر بردووە و ئەوەی وا شاری سلێمانی لە نزیکەوە بینیبێ ئەزانێ کە داری سەرو لە سلێمانی و دەوروبەری زۆرە ! )**

**" نالی " مەکە وەسفی تۆ .. باریکە نەمامی تۆ**

**مەعلوومە کە سەروی تۆ بێ میسلە لە دونیایە ص ٥٦٣ بیت ٦**

**" نالی " لە قووڵایی مانا و وشە تێگەیشتووە، بۆیە لە نێو شاعیرانی کلاسیکی کورددا هاوتاو هاوشێوەی کەمە. " نالی " بە شێعری خۆیەوە فەخری کردووە و بە ڕاستی ئەم شانازییە هەر شایانی خۆیە . ئەو وشە و واژانە بۆمان دەر دەخات کە لە زانستی زەمانی خۆیدا تا ڕادەیەک دەست ڕۆیشتوو بووە :**

**بولبولی تەبعم ئەوا دیسان سەنا خوانیی دەکا**

**نوکتە سەنجی و بەزڵەگۆیی و ، عەنبەر ئەفشانی دەکا ص ١٠١ بیت ١**

**شێعری خەڵقی کەی دەگاتە شێعری من بۆ نازکی؟!**

**کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لە گەڵ هەودا دەکا؟! ص ١٠٧ بیت ٥**

**" نالی " له خۆبایی بوون و فەخرفرۆشی ڕەد دەکاتەوە و فەخری خۆی له گەڵ غروور و له خۆبایی بوون به جیاواز دەزانێ و دەڵێ :**

**هەر کەسێ ئیزهاری دانایی بکات و ، مەقسەدی**

**خودپەسەندی بێ ، یەقین ئیزهاری نادانی دەکا ص ١٠١ بیت ٢**

**گەورە پیاوانی ئەدەبیاتی کوردی وەک " گیوی موکریانی " و " محەممەد ئەمین کاردۆخی " له " نالی " ڕەخنەیان گرتووە که بۆچی شێعری میللی و نەتەوایەتی و نیشتمانی نییە! یان بۆچی لەو قەسیدە بە ناو بانگەی خۆیدا ، هەجوی خاتوو " مەستوورەی ئەردەڵان " ی کردووە !؟ پێویستە لە وەڵامدا بێژین " نالی " له ڕۆژگارێکدا ژیانی بردۆتە سەر که کورد له سلێمانی دەستەڵاتی به دەستەوە بووە و حوکمڕانی بابان لەو پەڕی به هێزیدا بووە . بۆیە " نالی " کەلێنێکی له بواری میللیەوە هەست نەکردووە . ( وەرگێڕ : له لایێکیترەوە ناسیۆنالیزمی کوردیی لەو کاتەدا که عوسمانییەکان لەو پەڕی هێز و دەستەڵاتدا بوونە ، ئەوەندە پێش کەوتوو نەبووە و به داخەوە زۆرتر لایەنگریی لە بیر و باوەڕێکی تایبەتی دینی و مەزهەبی پێوەری ئەندێشەکان بووە . وا دەزانم هەر ئەوە که " نالی " دوای ئەو دووبەرەکییە دزێو و نەحسەی وا بەرۆکی به بابانەکان گرت ، سلێمانی به جێهێشت و ڕووی له شام کرد ، خۆی لەو پەڕی هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتیدا بووبێت . )**

**لەو کاتەدا که " نالی " ژیاوە زمانی عەرەبی ، زمانی عیلمیی و ئەدەبیی و فەرهەنگیی ئەو ڕۆژگارە بووە و بڕێ کەس ڕەخنەیان له " نالی " گرتووە ، که بۆچی به کوردی شێعر دەنووسێ و ، خۆی ئاوقەوی زمانی عەرەبی ناکات !؟ " نالی " له وەڵامدا فەرموویە :**

**کەس به ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە ، خۆ کردییە**

**هەر کەسێ نادان نەبێ ، خۆی تالیبی مەعنا دەکا ص ١٠٧ بیت ٣**

**له شوێنێکیتردا " نالی " هەر به ئەنقەست ئاماژە به کوردیی وێژی خۆی دەکات و دەڵێ :**

**تەبعی شەککەر باری من ، کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**

**ئیمتحانی خۆیە مەقسوودی ، له ( عمدا ) وا دەکا ص ١٠٧ بیت ١**

**زۆرن کەسانێ کە وا دەزانن هەر شاعیرێکی کورد دەبێ شێعری نەتەوایەتیی بڵێت و ئەگەر شاعیرێک لەم بوارەدا ئەسپی خەیاڵ و خامەی تاو نەدات ، ئیتر کەلێنێکی گەورەی هەیە لە ژیانی شاعیرییەتی خۆیدا ! پێویستە بڵێم کە لە ئەدەبی فارسیشدا ، جیا لەو کتێبە حەماسییانە ، تا دەورەی ( مشروطه ) ، شێعری میللی لە شێعری شاعیرانی فارس‌دا کەمتر ڕەنگی داوەتەوە !**

**" نالی " کەلێنەکانی شێعری کوردی بە بوونی خۆی و شێعرەکانی پڕ کردۆتەوە و جا ئەگەر شێعری میللی و نەتەوایەتیی نەوتووە ، لە لایێکی‌ترەوە بە هۆنینەوەی ئەو غەزەلە تەڕ و ئاودارانەوە ، بۆ هەتاهەتایە ئەدەبیاتی کوردیی پاراو کردووە و کردییە خاوەن ئەدەبی ( غنایی ) .**

**ڕەخنەیێک کە لە " نالی " گیراوە و زۆر لە سەری باس و خواست کراوە ، ئەو قەسیدە ناودارەیە کە گوایە " نالی " لە هەجوی " مەستوورە خانمی ئەردەڵان " دا وتوویەتی . ( هجو ) و ( هزل ) لە شێعری زۆرێک لە شاعیران ، تەنانەت شاعیرانێک وا سۆفی و عارف بوونە هەیە . ئەگەر " نالی " بە ڕوونی وەسفی ناڕەوای جەستەیی کردووە ، وەسفی ناڕەوا لە وتە و گوفتدا ، لە عالمی شاعیری‌دا ڕەوایە . لە شێعری " نالی " وشەی ناشیرین و سووک بە دی ناکرێت و وەسف لە لای " نالی " زۆرتر بە شێوەی ( استعارە ) و ( تشبیە ) و ( کنایە ) هاتووە . وەسفی " نالی " لە زۆر جێگادا وەک موعەمایێکی لێ دێ و ئەگەر کەسێک وەسف و ئیشاراتی " نالی " نەزانێ ، قەد ناتوانێ تێگەیشتنێک کە " نالی " مەبەستی بووە ، لە شێعرەکانی بە دەستی بێنێت .**

**لە شیعری فارسی ، مەولانا لە " مثنوی و معنوی " دا چەند جارێک ، وەسفی ناڕەوای بە ڕوونی هێناوە و " سعدی " لە ( هزلیات ) و ( گلستان و بوستان )یدا بە ئیستعارە و " عبید زاکانی " لە ( رسالەی دلگشا ) دا و " ایرج میرزا " لە شێعرەکانی‌دا ، ئەم جۆرە وەسفەیان کردووە . " نالی " لە پێشەکی ئەو قەسیدەیەدا دەڵێ ؛ ئەمە خەوە ! ئیتر منی خوێنەری شێعرەکە ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم وەسفانە ، وەسفێکی خەیاڵی و دوور لە ڕاستییە !**

**دەتوانین ئەم شێعرە بخەینە بازنەی ( هجوی نمایشی و خیالی ) ییەوە . نالی لەم شێعرەدا نایەوێ مەستوورە هەتک بکات و بە سووکیی و ناشیرینیی ناوی ببات . بەڵکوو ئەم شێعرە هەڵقوڵاوی ناخ و دەروونی شاعیرە و بەس ! لە لایێکی ترەوە ئەم جۆرە هەجوانە لە ئەدەبی کوردی‌دا زۆر کەمن و پێ دەچێ " نالی " یەکەم کەس بێت کە وێراوە و ئەوەی کردبێت کە لەو پەڕی جوانیی دا شێعری وا بخولقێنێت .**

**وەسفی " نالی " لە مەعشووق ئەوەندە جوان و شاعیرانەیە کە لە ئەدەبییاتی کورد و فارس و عەرەب دا وێنەی زۆر کەمە . ناسینی " نالی " و شیعری ئەو ، بەو ئاسانییە کە بیری لێ بکەینەوە نییە و توانای**

**زانستیی و ئەدەبیی دەویٚ . شیٚعری " نالی " ، شیٚعری مەکتەبی ڕۆمانتیکە و ئەگەر بە چاوی وردەوە سەیری شیٚعرەکانی بکەین، شیٚعریشی لە مەکتەبی " ڕئالیسم " دا هۆنیوەتەوە . بەڵام سەرجەم دیوانەکەی " نالی " وامان بۆ دەر دەخات کە " نالی " شاعیریٚکی ڕۆمانسییە .**

**" نالی " لە هەر بواریٚکدا ئەسپی خەیاڵ و خامەی تاو دابیٚ ، بە جوانیی سیحری وشە و کەلامی ئاشکرایە . کاتیٚ لە وەسفی پیریدا دەفەرمیٚ :**

**مووی سپی کردم بە شووشتن، ئاوی عەینی شۆرە شەت**

**شۆرە شەت یەعنی کە تیٚدا، خود بە خود قەل بوو بە بەت          ص ٢٤٢ بیت ١**

**یا کاتیٚ لە وەسفی پیٚکەنینی یار و گریانی خۆیدا فەرموویەتی :**

**من گریە ، ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین**

**من لەعلی بەدەخشان و ، ئەتۆ لوئلوئی لالا          ص ١١٥ بیت ٤**

**لە کۆتاییدا هەر ئەوە ماوە بیٚژین کە با هەوڵ بدریٚت " نالی " و هەموو کەڵە نووسەر و شاعیرانی ئەم گەلە ، ئەو جۆرە کە شیاویانە و شایستەیانە بە نەوەی داهاتوومان بناسریٚن . با نەوەی و بەرەی ئیٚستامان خۆیان بە بەر پرسیار بزانن لە پاراستنی ئەم گەنجینە گەورە و دەوڵەمەندە.بە ڕاستی ئەدەب و ویٚژەی کوردی دەریاییٚکە پڕ لە مرواریدی بەنرخ،دەبیٚ لاوانی ئەمڕۆمان گرنگیی و بایەخی پیٚ بدەن.**